### ئایا کام شێوازی ڕێگری گونجاوترە؟

هەر وەك لەم بەشەدا بینیمان شێوازی گونجاوی ڕێگری لەسکپڕیی بۆ هەر ژنو پیاوێك بەگوێرەی تەندروستی جەستەیی، دەروونی، دابونەریتو سەلیقەیان، هەروەها سەرنجدان لەوەی کە لەچ قۆناغێکی ژیانی هاوبەشیاندان، جیاوازە. بێگومان شێوازێك بۆ ژنومێرد گونجاوە کەتیایدا نەخۆشییە تایبەتیەکانی ژنو پیاو، کێش، تەمەن، ژمارەی منداڵو تەمەنی ژیانی هاوبەش لەبەر چاو گیرابێت.

هۆکاری گرنگ لەهەڵبژاردنی شێوازی گونجاو بۆ ڕێگری ئاستی دڵنیاکەرەوەی ئەو شێوازە یان هەمان رادەی سەرنەکەوتنیەتی. دیارە ئەگەر ژنو مێردێك تازە زەماوەندیان کردبێتو لەئەنجامی پەیڕەوکردنی شێوازێکی جێی متمانە وەك کۆندۆمدا مناڵیان بێت، بەرنامەکەیان تێکدەچێتو دەبێتە هۆی نائاسودەییان، بەڵام هەر ئەم رووداوە ئەگەر بۆ ژنو مێردێك رووبدات کەژمارەی مناڵەکانیان تەواوە یاخود ئەو ژنەی نەخۆشی دڵی هەیەو سکپڕی بۆ ئەو دەبێتە حوکمی مەرگ، ئەوا کارەساتێك دەقەومێت.

بەگشتی شێوازێکی گونجاوی بەرگری لەسکپڕیی پێویستە رادەی هەڵەکانی زۆر کەم بێت، بەم پێوانەیە شێوازی بەستنی لوولەکانی پیاوو ژن بەپلەی یەکەم دێن. حەبو دەرمانی کوتانو دژە سکپڕییو هۆرمۆنی چاندن لەم روانگەوە بەپلەی دووهەم دێنو دوابەدوای ئەوانیش دەتوانین ئاماژە بەدانانی ئای. یو. دی بکەین. ئامرازی





بەرگریکەری تر وەك کۆندۆم، لەولەب، کڵاوەی زێو ماددەی سپێرمکوژ کیمایی کە بەگشتی هێزی کۆسپ نانەوەیان بەیەك رادەیە، دەکەونە پلەی چوارەم. ئەو شێوازانەش کەزۆر جێگەی متمانەنین شێوازی جووتبوونی پچڕ پچڕو ڕۆژژمێرین.